# دوعاو پاڕانەوە

## لەقورئان و فەرموودەکان

نووسن و ئامادەکردنی
دایکی عەممار

# دوعاوپاڕانەوە

## لە قورئان و فەرموودەکان

نووسین و ئامادەکردنی

دایکی عەممار

چاپی یەکەم

١٤٤١ کۆچی

٢٠٢٠ زاینی

# بسم الله الرحمن الرحيم

## | گەورەیی دوعاكردن

(وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ (غافر: ٦٠)

**واتە**:ئەی خەڵكینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆمن بهێنن؛ ئەوە من دوعاو نزاتان گیرا دەكەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن ولووت بەرزی دەكەن لەئاستی پەرستنی مندا، لەئاییندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتی یەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

(وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ)(البقرة: ١٨٦)**واتە** : ئەی محمد ﷺ ئەگەر بەندەكانی من پرسیاری منیان لێت كرد ئەوە من لێیانەوە نزیكم بە زانست و زانیاری و بیستن و بینین و تواناو دەسەڵات و ویست و ئیرادە، بەڵام زاتی پیرۆزی خوای گەورە لەسەر عەرشە هەر كەسێك لە من بپاڕێتەوە ئەوا وەڵامی ئەدەمەوە یان ئەوەتا بۆی جێبەجێ ئەكەم، یان بە ئەندازەی ئەوە بەڵاو موسیبەتی لەسەر لائەدەم، یان لە قیامەتدا پاداشتی ئەدەمەوە بەڵام بەو مەرجەی ئەوانیش با لە من بپاڕێنەوە، یان وەڵامی بانگەوازی من بدەنەوە، وە با ئیمانم پێ بێنن بەڵكو خوای گەورە بیانخاتە سەر ڕێگای ڕاست و هیدایەتیان بدات.

  

**بۆ وەڵام دانەوەی دوعا هەندێك مەرج هەیە كەدەبێت جێ بەجێ بكرێت ئەمانەن:-**

**١-(ئیخلاص)بوون بۆ خوا .**

**٢-بە سوپاس و ستایش كردی خوا و پاشان صڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەست پێبكات .**

**٣-یەكلابوونەوە لە داواكردن و دڵنیابوون بە وەڵامدانەوەی.**

**٤-داكۆكی كردن لە پاڕانەوە و داواكردن و پەلە نەكردن .**

**٥-ئامادەبوونی دڵ و بیروهۆش لە كاتی پاڕانەوەدا .**

**٦-پاڕانەوە و دوعاكردن لە كاتی خۆشگوزرانی و تەنگانەدا .**

**٧-داوا لە كەس نەكات جگە لە خوا نەبێت بەتەنها .**

**٨-داننان بە تاوان و داوای لێخۆشبوون لـێی**

**، وە داننان بە ناز و نیعمەتەكانی خوا و شوكر و سوپاس كردنی لەسەری .**

**٩-مەلكەچی دەبڕین و خۆشكاندنەوە و ئارەزووكردنی خێر و تەرسان لە خراپە هاتنە ڕێ .**

**١٠-پاڕانەوە سێ جار سێ جار .**

**١١-ڕووكردن لە قیبلە .**

**١٢-بەرزكردنەوەی دەستەكان لە كاتی پاڕانەوەدا .**

**١٣-دەستنوێژ گرتن لە پێش پاڕانەوە و دوعا كردن ئەگەر كرا .**

**١٤-زیادەڕەووی نەكات لە پاڕانەوەدا .**

**١٥-دوعاكار لە خۆیەوە دەست پێبكات ئەگەر بۆ جگە لە خۆی دوعای كرد .**

**١٦-تكا كردن لە خوا بە خاتری ناوە چاكەكان و سیفاتە بەرزەكانی ، یان بە خاتری كردەوەیەكی چاك كە كەسی دوعاكار خۆی ئەنجامی دابێت .**

**١٧-پاڕانەوەکەی تاوان و بچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی تێدا نەبێت .**

**١٨-دوورکەوتنەوە لە هەموو تاوانەکان .**

**١٩-لەکاتی دوعاکردن بەم دوعایە بپاڕێتەوە : (لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ).**





## ئەو کات و حاڵەت و شوێنانەی کەوا دوعایان تێدا گیرادەبێت:-

١- شەوی قەدر .

٢-سێیەکی کۆتایی شەو .

٣-لەکۆتایی نوێژە فەڕزەکان.

٤-لەنێوان بانگ و قامەت .

٥-لەکاتی بانگدان بۆنوێژە فەڕزەکان.

٦-لەکاتی باران بارین.

٧-کاتێکی تایبەت لەڕۆژی جومعەدا ،وە ڕاسترین وتەیش تێیدائەوەیەکەوا دوا سەعاتە لەسەعاتەکانی ڕۆژی جومعە ،وەلەوانەشە کاتی وتارو نوێژی جومعەبێت.

٨-لەکاتی سوجدەبردندا.دوعایەی کەلەفەرمودە هاتووە لەبارەیەوە .

٩-ئەگەر بەلەش پاکی و دەست نوێژەوە بخەویت و ئەنجا بەخەبەر بێتەوە لەشەودا بپاڕێتەوە دوعابکات.

١٠-دوعاو پاڕانەوەی خەڵکی لەپاش وەفات کردنی مردوو.

١١-دوعاو پاڕانەوە لەپاش ستایش کردنی خواو صڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ـ ﷺ ـ لەتەحیاتی کۆتایی نوێژدا .

١٢-لەکاتی پاڕانەوە لەخوا بەناوی هەرەگەورەیی کەوا ئەگەر پێی بپاڕێتەوە لێی وەڵامتدەداتەوە ،وەئەگەر پێی داوابکەیت لەخوا ئەواپێت دەبەشێت .

١٣-پاڕانەوەو دوعاکردنی موسڵمان بۆبرای موسڵمانی بەپەنهانی و بێئەوەی خۆی ئاگای لێبێت.

١٤-پاڕانەوەو دوعاکردنی ڕۆژی عەرەفەلەڕۆژی عەرەفەدا .

١٥-پاڕانەوەو دوعاکردن لەمانگی ڕەمەزان

١٦-دوعاکردن لەکاتی کۆبوونەوەی موسڵمان لەکۆڕەکانی زیکردا.

١٧-پاڕانەوەو دوعای ستەم لێکراو لەوکەسەی کە ستەمی لێکردووە

١٨-پاڕانەوەو دوعای باوک بۆمنداڵەکانی و لەمنداڵەکانی .

١٩-پاڕانەوەو دوعای موسافیر.

٢٠-پاڕانەوەو دوعای ڕۆژووان تاکوبەربانگ دەکاتەوە.

٢١-پاڕانەوەو دوعای ڕۆژووان لە کاتی بەربانگکردنیدا.

٢٢-پاڕانەو دوعای ناچار و لێقەوماو .

٢٣-پاڕانەوەو دوعای کاربەدەستی دادوەر .

٢٤-پاڕانەوەی دوای دەست نوێژ ئەگەر بپاڕێیتەوە بەودوعایەی کەلەفەرمودەدا هاتووە لەبارەیەوە.

٢٥-دوعاکردن لەنێو کەعبەدا لەکاتی تەواف کردندا .

٢٦-دوعاکردن لەسەر کێوی صەفا.

٢٧دوعاکردن لەسە رکێوی مەڕوە.

الْحَمْدُلِلّهِ وَحْدَهُ وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ عَلَىٰ مَنْ لَانَبِيَّ بَعْدَهُ

**دوعا و پاڕانەوە لە قورئان و فەرموودە کاندا**

**١-﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾** (١٢٧ - البقرة) .

**ئەی پەروەردگارمان لێمانی قبوڵ بکە بەڕاستی تۆ بیسەر و زانایت .**

**٢-﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾** (٢٠١:البقرة)

**ئەی پەروەردگارمان لە دونیادا چاکەمان بدەرێ و لە دوارۆژیش چاکەمان بدەرێ و بشمانپارێزە لە سزای ئاگر .**

**٣-﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾** (البقرة: ٢٨٥)

**داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەین ئەی پەروەردگارمان وە هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە .**

**٤-﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِين﴾**(٢٨٦:البقرة) .

**ئەی پەروەردگارمان ئەگەر لەبیرمانچو یان هەڵەمان کرد ئەوا لێمان مەگرە ، پەروەردگارمان نارەحەتی مەدە بەسەرماندا وەکو چۆن دابوت بەسەر ئەوانەی پێش ئێمەدا ، پەروەردگارمان شتێك مەدە بەسەرماندا کە لە تواناماندا نەبێت ، وە لێمان ببورە**

و لێمانیش خۆشبە و ڕەحممان پێ بکە تۆ پشت و پەنامانی بۆیە سەرمان بخە بە سەر گەلی بێباوەڕاندا .

٥- ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾ (٨:آل عمران) .

ئەی پەروەردگارمان دڵەکانمان لامەدە لە ڕێگای ڕاست دوای ئەوەی کە ڕێنماییت کردین بۆی ، وە لە لایەن خۆتەوە ڕەحمەتمان پێ ببەخشە بەڕاستی تۆ بەخشندەیت .

٦-﴿رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾(١٦:آل عمران) .

ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێنا جا لە بەر ئەوە لە تاوانەکانمان خۆشبە و بەزەیت پێماندا بێتەوە تۆ باشترینی بە بەزەییەکانیت.

٧-﴿رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾(آل عمران: ٣٨)

پەروەردگارا نەوەی چاک و پاکم پێ ببەخشە، بەڕاستی تۆ بیسەری دوعا و نزایت.

٨-﴿رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنْزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾(٥٣:آل عمران) .

ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێنا بەوەی کە داتبەزاندووە و شوێنی پێغەمبەریش کەوتین بۆیە لەگەڵ شایەتومان هێنەراندا بمان نووسە .

٩-﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾(١٤٧:آل عمران) .

ئەی پەروەردگارمان لە تاوانەکانمان و ڕۆچونمان لە کاروبارماندا خۆشبە و پێکانیشمان جێگیر بکە و سەریشمان بخە بە سەر گەلی بێباوەڕاندا.

١٠-﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ۝رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ۝رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ۝رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ﴾(آل عمران: ١٩٤)

پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروست کراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکیی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ۝ئەی پەروەردگارمان هەرکەس تۆ بیخەیتە ئاگری دۆزەخەوە ئەوە بێگومان ڕیسوات کردووە، وە هیچ پشتیوانێک نی یە بۆ ستەمکاران۝ ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگخوازێک بوو بانگی ئەکرد بۆ بڕوا هێنان(دەی وت) بڕوا بێنن بە پەروەردگارتان دەست بەجێ بڕوامان هێنا ئەی پەروەردگارمان دەی لە گوناهەکانمان خۆش ببە و بسڕەوە لێمان خراپەکانمان و بمان مرێنە لەگەڵ چاکاندا۝ئەی پەروەردگارمان پێمان ببەخشە(لە پاش مردن) ئەوەی بەڵێنت پێداین لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکانت و ڕیسوامان مەکە لە ڕۆژی دوایی دا(هەستانەوە) بێگومان تۆ بەڵێن ناشکێنیت.

١١-﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾(المائدة: ٨٣)

**ئەی پەروەردگارمان ئەوا ئێمە باوەڕمان هێنا دەتۆش لەگەڵ شایەت دەران ناومان بنوسە.**

**١٢ـ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنْ الْخَاسِرِينَ﴾** (٢٣ - الأعراف)

**ئەی پەروەردگارمان ئێمە ستەممان کرد لە خۆمان جا ئەگەر تۆ لێمان خۆشنەبیت و ڕەحمان پێ نەکەیت ئەوا بەدڵنیایی دەبین بە بەشێك لە خەسارۆمەندان .**

**١٣-﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾** (الأعراف: ٤٧)

**پەروەدگارا مەمانگێڕە لەگەڵ دەستەی ستەمکاراندا.**

**١٤-﴿حَسْبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ﴾** (التوبة: ١٢٩)

**هیچ پەرستراوێك نی یە بێجگە لە ئەو تەنها پشت بەو دەبەستم ئەویش پەروەردگاری عەرشی گەورەیە.**

**١٥-﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِين۝وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾** (يونس: ٨٦)

**ئەی پەروەردگارمان نەمانکەیتە جێی تاقیکردنەوە بۆ گەلی ستەمکاران ۝وە ڕزگارمان بکە بە بەزەیی خۆت لەدەست کۆمەڵی بێ بڕوایان.**

**١٦ـ﴿رَبِّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْأَلَكَ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي أَكُن مِّنَ الْخَاسِرِينَ﴾** (هود-٤٧)

**ئەی پەروەردگارم، بەڕاستی من پەنا دەگرم بۆ تۆ کە داوای شتێك بکەم زانیاریم پێی نەبێت، خۆ ئەگەر لێم خۆش نەبیت و بەزەییت پێمدا نەیەتەوە ئەوە دەچمە ڕیزی خەسارەتمەندانەوە.**

**١٧-﴿رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ﴾** (إبراهيم: ٣٥)

**پەروەردگارا، باڵی هێمنی و ئاسایش بکێشە بەسەر ئەم شارو وڵاتەداو خۆم و نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی کە بتەکان بپەرەستین.**

**١٨ـ﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ﴾**(٤٠ - إبراهيم) .

**ئەی پەروەردگارم خۆم و نەوەکانم بگێرە لەو کەسانەی کە نوێژ دەکەن بە ڕێکی ، ئەی پەروەردگارمان دوعا و پاڕانەوەم گیرابکە .**

**١٩-﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ﴾**(٤١ - إبراهيم)

**ئەی پەروەردگارمان خۆشبە لە تاوانەکانی خۆم و باوك و دایکم و باوارِداران لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا .**

٢٠-﴿رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾ (١٠:الكهف) .

ئەی پەروەردگارمان لە لایەن خۆتەوە ڕەحمەتمان پێ ببەخشە و هۆشمەندیمان بۆ بڕەخسێنە لە کاروبارماندا .

٢١-﴿رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ۞ وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي ۞ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ۞ يَفْقَهُوا قَوْلِي﴾(طه: ٢٥)

پەروەردگارا سینە و دڵ و دەروونم ئاسوودە و گوشاد بکە ۞ ئیش و کارو هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکە ۞ گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە ۞ بۆ ئەوەی لە قسەکانم تێ بگەن.

٢٢-﴿رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ (طه: ١١٤)

پەروەردگارا، بەردەوام زانست و زانیاری زۆرترو زیاترم پێ ببەخشە.

٢٣-﴿ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ ( الأنبياء : ٨٧) .

خوایە هیچ پەرستراوێك نیە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت پاکی بۆ تۆ خوایە لە هەموو کەمی و نوقوسانیەك بەڕاستی من یەکێکم لە ستەمکاران بۆیە لێم خۆشبە .

٢٤-﴿رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ﴾ (الأنبياء: ٨٩)

ئەی پەروەردگارم بەتەنها مەمهێڵەرەوە (منداڵێکم پێ ببەخشە) وە تۆ چاکترین میراتگرانی.

٢٥-﴿رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ۝وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ﴾ (المؤمنون: ٩٨)

ئەی پەروەردگارم پەنا دەگرم بە تۆ لە خەتەرە (و پاڵنەر)ووەسوەسەی شەیتانەکان۝وە پەنات پێ دەگرم لەوەی (شەیتانەکان) ئامادەبن لام سەرم لێ بشێوێنن.

٢٦-﴿ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ (المؤمنون: ١٠٩)

ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە دەی لێیان خۆش بەو ڕەحممان پێ بکە چونکە تۆ چاکترینی میهرەبانانی.

٢٧-﴿رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾(المؤمنون: ١١٨)

ئەی پەروەردگارم لێم خۆش بەو ڕەحمم پێ بکە وە تۆ (خوایە) چاکترینی میهرەبانانی.

٢٨-﴿رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾(٦٥:الفرقان)

ئەی پەروەردگارمان سزای دۆزەخمان لـێ دوور بخەرەوە بەڕاستی سزاکەی سەخت و نارەحەتە .

٢٩-﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾(٧٤:الفرقان) .

ئەی پەروەردگارمان پێمان ببەخشە لە خێزانەکانمان و وەچەکانمان ئەوەی کە چاوەکانمان پێی ئۆقرە بگرێت و بمانکەرە پێشەوا بۆ خۆپارێزەران لە تاوان .

٣٠-﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ۝ وَٱجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ۝ وَلَاتُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ﴾ (الشعراء: ٨٧)

ئەی پەروەردگارم دانایم پێ ببەخشە بمبەرە ڕیزی پیاوچاکانەوە ۝ وە بم گێڕی لەوەرگرانی بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت ۝ وە شەرمەزار و ڕیسوام مەکە لە ڕۆژێکدا کە (خەڵکی) زیندوو دەکرێنەوە.

٣١-﴿ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾(النمل: ١٩)

ئەی پەروەردگارم وام ڕابێنە کە سوپاسی ئەو چاکە و نیعمەتەکانت بکەم کە ڕشتووتە بەسەر من و دایك و باوکمدا وە (ڕام بێنە) کە کارو کردەوەی چاکە بکەم کە تۆ پێی ڕازی بێت وە بە بەزەیی خۆت بمخەرە ڕیزی بەندە چاکەکانت.

٣٢-{قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي} (القصص: ١٦)

وتی ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من ستەمم لە خۆم کرد دەی لێم خۆشبە.

٣٣-﴿ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (القصص: ٢١)

ئەی پەروەردگارم ڕزگارم بکە لەم کۆمەڵە ستەمکارە.

٣٤-﴿عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾(القصص: ٢٢)

پەروەردگارم ڕێنموونیم بکات بۆ ڕێگای ڕاست وحەق.

٣٥-﴿ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴾(القصص: ٢٤)

پەروەردگارا بەڕاستی تۆ خێرو بێری زۆرت بەسەردا ڕژاندووم، بەڵام هێشتا هەژارم و ئاتاجی بەخششی زیاترم.

٣٦-﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِي عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾(العنكبوت: ٣٠)

ئەی پەروەردگار سەرم بخەی بەسەر ئەم قەومە ئاشووبگێڕەدا.

٣٧-﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾(الصافات: ١٠٠)

ئەی پەروەردگارم منداڵێکی چاکم پێ ببەخشە.

٣٨-﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓ ۖ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾(الأحقاف: ١٥)

ئەی پەروەردگار ڕام بێنە تا شوکرانە بژێری ئەو بەهرە و چاکەت بکەم کە ڕشتوتە بەسەر من و دایك و باوکم دا وە (ڕام بێنە) کردەوەی چاك بکەم کە تۆ پێ ی ڕازی بی نەوەکانیشم چاك و صالّح بکە بێگومان بۆ لای تۆ گەڕاومەتەوە وە بەڕاستی من لە موسوڵمانی گەردن کەچم.

٣٩-﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ (١٠ - الحشر) .

ئەی پەروەردگارمـــــان خۆشبە لە ئێمە و ئەو برایانەشـــمان کە پێشمان کەوتوون بە ئیمان وە ڕق و کینە نەخەیتە ناو دڵمانەوە بەرامبەر بە ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ، ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ بە بەزەیی و بە ڕەحمیت .

٤٠-﴿رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾(الممتحنة: ٤).

ئەی پەروەردگارمان تەنها پشتمان بە تۆ بەستووە وە هەر بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە سەرئەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە.

٤١-﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (٥ - الممتحنة) .

ئەی پەروەردگار لێمان خۆشبە هەر تۆ زۆر باڵادەست وبەعیزەت و کاربەجێ و دانایی .

٤٢-﴿رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير﴾ (٨:التحريم)

ئەی پەروەردگارمان ڕووناکی باوەڕمان بۆ کامڵ کە و لێمان خۆشبە بەڕاستی تۆ توانات بە سەر هەموو شتێکدا هەیە .

٤٣-﴿رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾(نوح: ٢٨)

پەروەردگاراله خۆم و دایک و باوکم و ئەوانە خۆش ببە کە دێنە ماڵم بە ئیمان و باوەڕەوە، هەروەها لە ئیماندارانی پیاوو ئیماندارانی ئافرەتیش خۆش ببە.

٤٤-﴿اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾البخارى.

پەروەردگارمان لە دونیادا چاکەمان بدەرێ و لە دوارۆژیش چاکەمان بدەرێ و بشمانپارێزە لە سزای ئاگر .

٤٥-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ النَّارِ ، وَفِتْنَةِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْفَقْرِ ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ قَلْبِي بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ﴾مسلم.

خوایە من پەنات پێدەگرم لە فیتنەی ئاگر و سزای دۆزەخ ، وە پەنات پێدەگرم لە فیتنەی گۆڕ و سزای گۆڕ ، وە لە خراپەی تاقیکردنەوەی دەوڵەمەندی ، وە لە خراپەی تاقیکردنەوەی هەژاری و نەداری ، خوایە من پەنات پێدەگرم لە فیتنە و تاقیکردنەوەی دەجالی چاو سڕاوە ، خوایە دڵم بشۆ بە ئاوی بەفر و تەرزە ، وە دڵم پاك بکەرەوە لە تاوانەکان هەروەکو چۆن جلێکی سپیت پاك کردبێتەوە لە لەکە و پەڵە ، وە نێوان من و تاوانەکانم دوور بخەرەوە هەروەکو چۆن نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوات دوور خستووەتەوە ، خوایە من پەنات پێدەگرم لە تەمبەڵی و تاوانباری و قەرزاری .

٤٦- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ، وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ، وَالْهَرَمِ، والْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَاوَالْمَمَاتِ﴾البخارى ،مسلم.

خودایە من پەنات پێدەگرم لە بێ توانایی و ، تەمبەڵی، وترسنۆکی ،وپیری ، و ڕەزیلی ،و وە پەنات پێدەگرم لە فیتنەی گۆڕ و سزای گۆڕ ، و فیتنەی ژیان و مردن.

٤٧-﴿اللهمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ﴾البخاري ، مسلم.

خوایە پەنات پێ ئەگرم لەوەی بەڵاو ناڕەحەتی بەسەرما زاڵ بێت.وە بەخەتێکی خراپم بێت وتوشی ناڕەحەتی بم .قەزاو قەدەرێکی وات بۆم بڕیاردابێت قورس بێت وە پەنات پێ ئەگرم لەوەی دوژمنەکانم پێم پێ بکەنن لەوەی کە لەناڕەحەتیام .

٤٨-﴿اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي، وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَرٍّ﴾مسلم.

خودایە دینداریەکەم بۆ چاک بکە کە پاراستنی گوزەرانمی پێوە بەندە ، وە بواری دونیاشم بۆ چاك بکە کە ژیانمی تێدایە، وە بواری دواڕۆژیشم بۆ چاك بکە کە گەڕانەوەمی تێدایە، وە ژیانم بکە بەمایەیی زیادبوونی هەموو خێرێك بۆم، وەمردن بکە بەمایەی  ئیسراحەت بۆم لەهەموو خراپەیەك.

٤٩-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى، وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ، وَالْغِنَى﴾مسلم.

خودایە من داوای هیدایەت و خۆپاراستن لە تاوان و پاکێتی ودەوڵەمەندیت لێدەکەم .

٥٠-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْـجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَالْـهَرَمِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ ، اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا ، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا ، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَـخْشَعُ ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ وَمِنْ دَعْوَةٍ لَا يُسْتَجَابُ لَـهَا﴾مسلم.

خوایە من پەنات پێدەگرم لە بێدەسەڵاتی و تەمبەڵی و ترسنۆکی و ڕەزیلی و پیری و سزای گۆڕ ، خوایە ویستی خۆپاراستن لە تاوان ببەخشە بە ناخ و دەروونم ، وە پاك و خاوێنی کەرەوە لە ویستی تاوان و خراپەکردن چونکە تۆ باشترین کەسیت خاوێنی کەیتەوە ، خوایە تۆ سەرپەشتیار و خاوەنی ناخ و دەروونمی ، خوایە من پەنات پێدەگرم لە زانستێك کە سوودی نەبێت ، وە لە دڵێك کە لە تۆ نەترسێت ، وە لە دەروونێك کە تێر نەبێت ، وە لە پاڕانەوەیەك کە وەڵام نەدرێتەوە .

٥١-﴿اللَّهُمَّ اهْدِنِي وَسَدِّدْنِي، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالسَّدَادَ﴾مسلم .

خوایە هیدایەتم بەیت و کارەکانم لەسەر ئاسان بکەیت وە خوایە ڕێنمویم بکەیت و کاروبارم بۆ جێبەجێ بکەیت

٥٢-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ ، وَتَحْوِيلِ عَافِيَتِكَ ، وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ﴾مسلم.

خوایە من پەنات پێدەگرم لە نەمانی نیعمەتەکانت ، وە لە گۆڕاندنی خۆشگوزرانیت ، وە لە کوتوپڕی تۆڵەسەندنەوەت ، وە لە هەموو تووڕەییکت .

٥٣-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ﴾مسلم.

خودایە پەنات پێدەگرم لە خراپەی ئەوەی کە ئەنجامم داوە ، وە لە خراپە و زیانی ئەوەشی کە ئەنجامم نەداوە.

٥٤-﴿اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالِي، وَوَلَدِي، وَبَارِكْ لِي فِيمَتا أعْطَيْتَنِي(٣)[وَأطِلْ حَيَاتِي عَلَى طَاعَتِكَ، وَأحْسِنْ عَمَلِي،] وَاغْفِرْ لِي﴾البخارى.

خودایە سامانم زیادبکە ، مندالّم زیادبکە ، وە پیت و فەڕ بڕژێنە ئەوەی

پێتداوم(٣) وە تەمەنم زیادبکە لەسەر فەرمان بەرداربوونی خۆت ، و کردەوەکانم چاک بکە ، وەلێم خۆشبە.

٥٥-﴿لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ، وَرَبُّ الْأَرْضِ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾البخارى،مسلم.

هیچ پەروەردگارێکی بەحەق نییە تەنها الله نەبێ ئەو زاتەی کە گەورە و هێورە ، هیچ خودایەکی بەحەق نییە الله نەبێ ئەو زاتەی خاوەنی عەرشی گەورەیە ، هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە الله نەبێ خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی خاوەنی عەرشی بەرز و پیرۆز.

٥٦-﴿اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو فَلَا تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَأَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ﴾أبو داود.

خودایە داوای ڕەحمەتی خۆتت لێدەکەم ، نەمدەیتە دەستی خۆم بۆ چاو تروکانێکیش ، وە هەموو کارو بارو حالّمم بۆ چاک بکە چوونکە هیچ پەرستیوێکی دیکەی بەحەق نییە ئیلا تۆ نەبی.

**٥٧- ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾الترمذي.**

**(ئەی خوا) بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لە تۆ پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە بێگومان من لە ستەمکاران بووم.**

**٥٨-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ, ابْنُ عَبْدِكَ, ابْنُ أَمَتِكَ, نَاصِيَتِي بِيَدِكَ, مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ, عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ,أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ, سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ, أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ, أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ, أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ, أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي, وَنُورَ صَدْرِي، وَجَلاَءَ حُزْنِي, وَذَهَابَ هَمِّي ﴾أحمد.**

**واتە: خودایە من بەندەی تۆم و کوڕی بەندەی تۆم و کوڕی کۆیلەی تۆم، چارەنووسم بە دەستی تۆیە و بڕیارت بە سەرمدا تێپەڕیوە و بڕیارەکانت بە سەرمدا دادپەروەرانەیە، داوات لێدەکەم بە هەموو ئەو ناوانەی، کە خۆتت پێ ناو ناوە، یان ناردووتەتە خوارەوە لە پەرتووکەکەتدا، یان یەکێکت فێرکردووە لە بەندەکانت، یان لە زانستە نهێنیەکانی خۆتدا هەڵتگرتوە (کەس نایزانێت، جگە لە خۆت نەبێت)، کە قورئان بکەیتە بەهاری دڵم و ڕوناکی سینگم و ڕەوێنەرەوەی دڵ تەنگیم و لابەری خەم و پەژارەم.**

**٥٩-﴿اللَّهُمَّ مُصَرِّفَ الْقُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ﴾ مسلم.**

**ئەی ئەو خوایەی دڵەکان دەگۆڕیت دڵم بگۆڕە بۆ عیبادەتی خۆت.**

**٦٠-﴿يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّت قَلْبِي عَلَى دِينِكَ﴾الترمذي.**

**ئەی خوایە دڵم سابت بکە لەسەر دینەکەت .**

**٦١-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾**الترمذي.

**خوایە داوی سەلامەتیت لێ ئەکەم لەدونیاو قیامەت.**

**٦٢-﴿اللهمّ أحْسِنْ عَاقِبَتَنَا فِي الأُمُورِ كُلِّهَا، وَأَجِرْنَا مِنْ خِزْيِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ الآخِرَةِ﴾**أحمد.

**خوایە عاقیبەتمان چاک بکەلە هەموو کارەکانی دونیا وەمان پارێزە لەخراپی دونیا وە مان پارێزە لەسزای دواڕۆژ.**

**٦٣-﴿رَبِّ أَعِنِّي وَلَا تُعِنْ عَلَيَّ، وَانْصُرْنِي وَلَا تَنْصُرْ عَلَيَّ، وَامْكُرْ لِي وَلَا تَمْكُرْ عَلَيَّ، وَاهْدِنِي وَيَسِّرِ الهُدَى إِلَيَّ، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ بَغَى عَلَيَّ، رَبِّ اجْعَلْنِي لَكَ شَكَّارًا، لَكَ ذَكَّارًا، لَكَ رَهَّابًا، لَكَ مِطْوَاعًا، إِلَيْكَ مُخْبِتًا أَوَّاهاً مُنِيبًا، رَبِّ تَقَبَّلْ تَوْبَتِي، وَاغْسِلْ حَوْبَتِي، وَأَجِبْ دَعْوَتِي، وَثَبِّتْ حُجَّتِي، وَاهْدِ قَلْبِي، وَسَدِّدْ لِسَانِي، وَاسْلُلْ سَخِيمَةَ قَلْبِي﴾**أبو داود.

**خوایە یارمەتیم بدە و یارمەتی کەسیش مەدە لە سەرم ، وە سەرم بخە و کەسیش سەر مەخە بە سەرمدا ، پلانم بۆ داڕێژە و پلانیش دامەڕێژە لە سەرم ، وە ڕێنماییم بکە و ڕێنمایی کردنیشم بۆ ئاس بکە ، وە سەرم بخە بە سەر ئەو کەسەی کە دەست درێژە دەکاتە سەرم ، خوایە وام لێبکە شوکرانەبژێری تۆ بم ، زیکری تۆ بکەم ، لە تۆ بترسم ، گوێڕایەڵی تۆ بکەم ، بۆ لای تۆ بگەڕێمەوە ، پەروەردگارم تەوبەم لێ قبوڵ کە ، وە تاوانەکانم بشۆرەوە ، وە وەڵامی دوعاکانم بدەرەوە ، وە بەڵگەکانم جێگیر بکە ، وە ڕێنمایی دڵم بکە ، وە زمانم ڕاست کەرەوە ، وە پۆخڵەواتی نێو دڵم دەربێنە.**

**٦٤-﴿اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ -ﷺ-، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا اسْتَعَاذَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ -ﷺ-، وَأَنْتَ الْمُسْتَعَانُ، وَعَلَيْكَ الْبَلَاغُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ﴾**الترمذي.

خوایە داوای خێری ئەوەت لێ دەکەین کە پێغەمبەرەکەت محمد ﷺ دوای لێکردووی و پەنات پەدەگرین لە شەڕی ئەوەی پێغەمبەرەکەت محمد ﷺ پەنای پێ گرتووی لێیداوای یارمەتی هەر لە تۆدەکرێت گەیاندنیش هەر لەسەر تۆیە و هیچ هەوڵ و هێزێك نیە تەنها ئەو هەول و هێزە نەبێت کە خودا دەیبەخشێت.

٦٥-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي ، وَمِنْ شَرِّ بَصَرِي ، وَمِنْ شَرِّ لِسَانِـي ، وَمِنْ شَرِّ قَلْبِـي ، وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّي﴾أبوداود.

خوایە من پەنات پێدەگرم لە خراپەی بیستنم ، وە لە خراپەی بینینم ، وە لە خراپەی زمانم ، وە لە خراپەی دڵم ، وە لە خراپەی ئاوی شەهوەتم .

٦٦-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبَرَصِ وَالْـجُنُونِ وَالْـجُذَامِ ، وَمِنْ سَيِّيءِ الأَسْقَامِ﴾أبوداود.

خوایە من پەنات پێدەگرم لە گولی و شێتی و گەڕی ، وە لە خراپترینی دەرد و نەخۆشیەکان .

٦٧-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ مُنْكَرَاتِ الْأَخْلَاقِ، وَالْأَعْمَالِ، وَالْأَهْوَاءِ﴾الترمذي.

خوایەی گیان پەنات پێدەگرم لە ڕەوشت وکردەوە و ئارەزوەی خراپەکان.

٦٨-﴿اللَّهُمَّ إِنَّكَ عُفُوٌّ كَرِيمٌ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي﴾ الترمذي.

خوایە تۆ لێخۆشبووی و لێخۆشبوونت خۆشدەوێت لێم خۆشبە.

٦٩-﴿اللَّهُمَّ إِنِّـي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْـخَيْرَاتِ ، وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ ، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ ، وَأَنْ تَغْفِرَ لِـي وَتَرْحَمَنِـي ، وَإِذَا أَرَدْتَ فِتْنَةَ قَوْمٍ فَتَوَفَّنِـي غَيْرَ مَفْتُونٍ، وَأَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُـحِبُّكَ ،وَحُبَّ عَمَلٍ يُقَرِّبُ إِلَـى حُبِّكَ﴾أخراج أحمد.

خوایە من داوای ئەنجامدانی چاکەکانت لـێدەکەم ، وە داوای وازهێنان لە خراپەکانت لـێدەکەم ، وە داوای خۆشەویستی هەژارانت لـێدەکەم ، وە داوات لـێدەکەم لێمخۆش بیت و بەزەیت پێمدا بێتەوە ، وە ئەگەر ویستت خەڵکانێك تووشی تاقیکردنەوە بکەیت ئەوا بمرێنە بە بێ تووشبوونم بە فیتنە ، وە داوای خۆشەویستنی خۆتت لـێدەکەم وە خۆشەویستنی ئەو کەسانەی کە تۆیان خۆش دەوێت ، وە خۆشەویستنی کردەوەیەك کە نزیك کەرەوە بێت بۆ لای خۆشویستنی تۆ .

٧٠-﴿اللَّهُمَّ إنِّـي أَسْأَلُكَ مِنْ الْخَيْرِ كُلِّهِ عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ ، مَا عَلِمْت مِنْهُ وَمَا لَـمْ أَعْلَمْ ، وَأَعُوذُ بِك مِنْ الشَّرِّ كُلِّهِ عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ ، مَا عَلِمْت مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ ، اللَّهُمَّ إنِّي أَسْأَلُك مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ عَبْدُك وَنَبِيُّك ، وَأَعُوذُ بِك مِنْ شَرِّ مَا عَاذَ مِنْهُ عَبْدُك وَنَبِيُّك ، اللَّهُمَّ إنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَمَا قَرَّبَ إلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ ، وَأَعُوذُ بِك مِنْ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ إلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ ، وَأَسْأَلُكَ أَنْ تَجْعَلَ كُلَّ قَضَاءٍ قَضَيْته لِي خَيْرًا﴾ابن ماجد.

خوایە من داوای خێرت لـێ دەکەم هەر هەموویی هی ئێستایی و داهاتوویی ئەوەی کە دەیزانم و ئەوەشی کە نایزانم ، وە پەنات پی دەگرم لە خراپە هەر هەموویی هی ئێستایی و داهاتوویی ئەوەی کە دەیزانم و ئەوەشی کە نایزانم ، خوایە من داوای ئەو خێرەت لـێ دەکەم کە بەندە و پێغەمبەرەکەت داوای لـێ کردوویت ، وە پەنات پی دەگرم لەو خراپەیەی کە بەندە و پێغەمبەرەکەت پەنای پێ لـێگرتووە ، خوایە من داوای بەهەشتت لـێدەکەم و ئەوەشی کە نزیك کەرەوەیە لـێی لە هەر گوفتار و کردارێك ، وە پەنات پێدەگرم لە ئاگر و ئەوەشی کە نزیك کەرەوەیە لـێی لە هەر گوفتار و کردارێك ، وە داواشت لـێدەکەم هەر بڕیارێك کە بڕیارت لە سەر داوە بۆم بە خێر بیگێڕیت .

٧١-﴿اللَّهُمَّ احْفَظنِي بالإِسْلاَمِ قائِماً، واحْفَظْنِي بالإِسْلاَمِ قاعِداً، واحْفَظنِي بالإِسْلاَمِ راقِداً، ولا تُشْمِتْ بِي عَدُوّاً ولا حاسِداً. اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ كُلِّ خَيْر خزائِنُهُ بِيَدِكَ، وأعُوذُ بِكَ مِنْ كُلِّ شَرٍّ خَزَائِنُهُ بِيَدِكَ﴾الحاكم.

خوایە بمپارێزە بە هۆی ئیسلامەوە لە کاتێکدا کە بە پێوەم ، وە بمپارێزە بە هۆی ئیسلامەوە لە کاتێکدا کە دانیشتووم ، وە بمپارێزە بە هۆی ئیسلامەوە لە کاتێکدا کە ڕاکشاوم ، وە بە گرفت و غەمی من دوژمن و چاولەسەربووانم خۆشحاڵ مەکە ، خوایە من داوای هەموو خێرێمت لێدەکەم کە خەزێنەکەی لە دەستی تۆ دایە ، وە پەنات پێ دەگرم لە هەموو خراپەیەك کە خەزێنەکەی لە دەستی تۆ دایە .

٧٢-﴿اللَّهُمَّ اقْسِمْ لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ مَا يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعَاصِيكَ ، وَمِنْ طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ جَنَّتَكَ ، وَمِنَ الْيَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَيْنَا مُصِيبَاتِ الدُّنْيَا ، وَمَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا ، وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا ، وَاجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا ، وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا ، وَلاَ تَجْعَلْ مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا ، وَلاَ تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا ، وَلاَ مَبْلَغَ عِلْمِنَا ، وَلاَ تُسَلِّطْ عَلَيْنَا مَنْ لاَ يَرْحَمُنَا﴾الترمذي.

خوایە ئەوەندە ترسان لە خۆتمان پێببەخشە کە ببێتە بەربەست لە نێوان ئێمە و سەرپێچی کردنتدا ، وە ئەوەندەش لە گوێڕایەڵی کردنت کە بمانگەیەنێتە بەهەشتەکەت، وە ئەوەندەش لە دڵنیایی کە ناهەموارییەکانی دونیامان لە سەر سووك بکاتەوە ، خۆشگوزرانمان بکە بە بیستنمان و بینیمان و توانامان ئەوەندەی کە دەمان ژێنیت ، وە ئەوانەش بکە بە میرات گری ئێمە ، وە تۆڵە لێسەندنەوەمان بخەرە سەر ئەوانەی کە ستەممان لـێدەکەن ، وە سەرمان بخە بە سەر ئەوانەی دژایەتیمان دەکەن ، وە ناهەمواریيەکانمان نەخەیتە نێو ئاینەکەمانەوە ، وە دونیا مەکەرە گەورە ترین مەبەستمان و ئامانجی زانستمان ، وە کەسێك زاڵا مەکە بە سەرماندا کە بەزەیی پێماندا نەیەتەوە .

٧٣-﴿اللَّهُمَّ إنِّي أَعوذُ بِكَ مِنَ الجُبْنِ، وَأعُوذُبِكَ مِنَ البُخْلِ، وَأعُوذُ بِكَ مِنْ أنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ العُمُرِ، وَأعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ القَبْرِ﴾الترمذي.

خودایە من پەنات پێدەگرم لەترسنۆکی ،و وەپەنات پێدەگرم لە ڕەزیلی،و پەنات پێدەگرم لەوەی کە تەواو پیرببم وە پەنات پێدەگرم لەفیتنەی دونیاو سزای ناو گۆڕ.

٧٤-﴿اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِـي وَجَهْلِي وَإِسْرَافِـي فِي أَمْرِي ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّـي ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي جِدِّي وَهَزْلِـي وَخَطَئِي وَعَمْدِي وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْت وَمَا أَخَّرْت وَمَا أَسْرَرْت وَمَا أَعْلَنْت وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّـي ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾البخارى.

خوایە لێم خۆشبە لە تاوانەکانم و نەزانینم و ڕۆچوونم لە کارەکانمدا و لەوەش کە تۆ زانا تری پێی لە من ، خوایە لێم خۆشبە لەوەی کە بە هەڵە و لەوەش کە بە ئەنقەست و لەوەش کە بە گاڵتە و لەوەش کە بە ڕاستی کردوومن وە هەموو ئەوانەشم هەیە ، خوایە لێم خۆشببە لەوەی کە پێشم خستووە و لەوەش کە دوام خستووە و لەوەش کە شاردوومەتەوە و لەوەش کە ئاشکرام کردووە ، خوایە تۆ پێشخـەر و تۆش دواخەریت ، وە تۆ توانات بە سەر هەموو شتێکدا هەیە .

٧٥-﴿اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ،وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِي، أَنْتَ الْحَيُّ الَّذِي لَا يَمُوتُ، وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ يَمُوتُونَ﴾البخاري.

ئەی پەروەردگار خۆم ڕادەستی تۆ کردوە، وە ئیمانم بە تۆ هێناوە وە تەنها پشتم بە تۆ بەستوە وە گەڕانەوەشم بۆ لای تۆیە وە بە پشتیوانی تۆ دەچم بەگژ دوژمنا و پەنا دەگرم بە عیزەتی تۆ هیچ خوایەك شایەنی پەرستن نیە بە حەق ئیلا تۆ نەبێت ، وەگومڕام بکات تۆ زیندووی ومردنت بەسەرنایەت جن و ئینسان دەمرن.

٧٦-﴿اللَّهُمَّ إنَّا نَسْألُكَ مُوجِباتِ رَحْمَتِكَ، وَعَزائِمَ مَغْفِرَتِكَ، والسَّلامَةَ مِنْ كُلِّ إثمٍ، والغَنِيمَةَ مِنْ كُلِّ بِرٍّ، والفَوْزَ بالجَنَّةِ، والنَّجاةَ مِنَ النَّارِ﴾الحاكم.

خوایە ئێمە داوای ڕەحمەتت لێدەکەین ، وەگەورەیی ولێخۆشبونت پارێزراومان کەیت لە هەموو گوناهێك دەوڵەمەندمان کە بە هەموو چاکەیەك ، سەرمان بخە بەبەهەشتەکەت ، وە ڕزگارمان بکە لە ئاگری دۆزەخ.

٧٧-﴿اللَّهُمَّ اجْعَلْ أَوْسَعَ رِزْقِكَ عَلَيَّ عِنْدَ كِبَرِ سِنِّي، وَانْقِطَاعِ عُمُرِي﴾ الحاكم.

خوایە ڕزقت لەسەرمان فراوان کە لەکاتی پیربونم وەلە کۆتایی تەمەنما.

٧٨-﴿اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، وَوَسِّعْ لِي فِي دَارِي، وَبَارِكْ لِي فِيمَا رَزَقْتَنِي﴾أحمد.

خوایە لەگوناهەکانمان خۆشبە ، وە فراوانی بکە ئەوەی لە ماڵمانایە، وەبەرەکەت بخەرە ئەوەی پێمدەدەیت.

٧٩ـ ﴿اللَّهُمَّ إِنِّـي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ وَرَحْمَتِكَ فَإِنَّهُ لَا يَـمْلِكُهَا إِلَّا أَنْتَ﴾ أخراج الطبراني.

خوایە من داوای چاکە و بەزەیی پێداهاتنەوەت لـێدەکەم ، چونکە بەڕاستی ئەوانە بە دەستی کەسەوە نیە تەنها تۆ نەبێت .

٨٠ـ ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الهَرَمِ، وَالتَّرَدِّي، وَالْهَدْمِ، وَالْغَمِّ، وَالْغَرَقِ، وَالْحَرَقِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّيْطَانُ عِنْدَ الْمَوْتِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ فِي سَبِيلِكَ مُدْبِرًا، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ لَدِيغًا﴾أخراج النسائي.

**خودایە من پەنات پێدەگرم لە داڕوخانی شتێك بەسەرمدا، وە پەنات پێدەگرم لە کەوتنە خوارەوە ، وە پەنات پێدەگرم لە خنکان و سوتان و پیری، پەنات پێدەگرم لەوەی شەیتان تێکەڵم ببێت و تێکمبدات لەکاتی مردندا وە پەنات پێدەگرم لەوەی کە بمرم لەکاتێکدا کە پشتم هەڵکردبێت لەتێکۆشان لەپێناو تۆدا،وە پەنات پێدەگرم لەوەی کە بمرم بە پێوەدراوی.**

**٨١ـ ﴿اللَّهُمَّ إِنِّـي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْـجُوعِ فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ الْـخِيَانَةِ فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ﴾** أبو داود.

**خوایە من پەنات پێدەگرم لە برسێتی چونکە بەڕاستی برسێتی خراپترین هاوڕێی سەر جێگایە ، وە پەنات پێدەگرم لە خیانەت و ناپاکی چونکە بەڕاستی خیانەت و ناپاکی خراپترین دەورەدەستن .**

**٨٢-﴿اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ العَجْزِ، والكَسَلِ، والجُبْنِ، والبُخْلِ، والهَرَمِ، والقَسْوَةِ، والغَفْلَةِ، والعَيْلَةِ، والذِّلَّةِ، والمَسْكَنَةِ، وأعُوذُ بِكَ مِنَ الفَقْرِ، والكُفْرِ، والفُسُوقِ، والشِّقاقِ، والنِّفاقِ، والسُّمْعَةِ، والرِّياءِ، وأعُوذُ بِكَ مِنَ الصَّمَمِ، والبَكَمِ، والجُنُونِ، والجُذامِ، والبَرَصِ، وَسَيِّىءِ الأَسْقامِ﴾** الحاكم.

**خوایە من پەنات پێدەگرم لە بێدەسەڵاتی و تەمبەڵی و ترسنۆکی و ڕەزیلی و پیری و دڵڕەقی و بێ ئاگایی وهەژاریی و بێ شوێنی ،وە پەنات پێدەگرم لە فەقیری ،و کفر وە لەسنوربەزاندنەکان ،و ناکۆکی ،و دوڕووی ،و بەد ڕەوشتی ،وە لە کارێک کە خەلکی ببینن و وە پەنات پێدەگرم لە گەڕی و لاڵی و شێتی و گەڕی ، وە لە خراپترینی دەرد و نەخۆشیەکان.**

**٨٣-﴿اللَّهُمَّ إِنِّـي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْفَقْرِ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ الْقِلَّةِ وَالذِّلَّةِ ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ﴾** النسائي و أبوداود.

**خوایە من پەنات پێدەگرم لە هەژاری ، وە پەنات پێدەگرم لە کەمێتی و سەرشۆڕی ، وە پەنات پێدەگرم لەوەی ستەم بکەم و لەوەش ستەمم لـێ بکرێت.**

**٨٤-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ جَارِ السُّوءِ فِي دَارِ الْمُقَامَةِ؛ فَإِنَّ جَارَ الْبَادِيَةِ يَتَحَوَّلُ﴾**الحاكم.
**خوایە من پەنات پێ دەگرم لە هاوسێی خراپ لە ماڵی مانەوە ، چونکە هاوسێی سەفەر نامێنێت لەگەڵت .**

**٨٥-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، ومِنْ دُعَاءٍ لاَ يُسْمَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لا تَشْبَعُ، وَمِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَؤُلاَءِ الأَرْبَعِ﴾**الترمذي.

**خوایە من پەنات پێ دەگرم لە دڵێک کە ملکەچ نەبێت وە لە دوعایەک کە نەبیسترێت وە لە نەفسێک کە تێر نەبێت وە لە زانستێک کە سوودی نە بێت وە پەنات پێ دەگرم لەم چوارە.**

**٨٦-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أعُوذُ بِكَ مِنْ يَوْمِ السُّوءِ، وَمِنْ لَيْلَةِ السُّوءِ، وَمِنْ سَاعَةِ السُّوءِ، وَمِنْ صَاحِبِ السُّوءِ، وَمِنْ جَارِ السُّوءِ فِي دَارِ الْمُقامَةِ﴾**أخراج طبراني.
**خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ڕۆژێکی خراپ وە لە شەوێکی خراپ وە لە کاتێکی خراپ وە لە هاورێکی خراپ وە لە هاوسێکی خراپ لە ماڵی مانەوە .**

**٨٧-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَأَسْتَجِيْرُ بِكَ مِنَ النَّارِ﴾(ثَلاَثَ مَرَّاتٍ)**الترمذي.
**خوایە گیان من داوای بەهەشتت لێدەکەم وە پەناتیش پێ دەگرم لە ئاگر. سێ جار**

**٨٨-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا, وَرِزْقًا طَيِّبًا, وَعَمَلاً مُتَقَبَّلاً﴾**أخرجه ابن ماجه.
**خودایە من داوای زانستی بەسوود و ڕۆزی پاک و حەڵاڵ و کردەوەی وەرگیراوت لێدەکەم.**

**٨٩-﴿اللَّهُمَّ بِعِلْمِكَ الْغَيْبَ، وَقُدْرَتِكَ عَلَى الْخَلْقِ، أَحْيِنِي مَا عَلِمْتَ الْحَيَاةَ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا عَلِمْتَ الْوَفَاةَ خَيْرًا لِي، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَشْيَتَكَ فِي الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، وَأَسْأَلُكَ كَلِمَةَ الْحَقِّ فِي الرِّضَا وَالْغَضَبِ، وَأَسْأَلُكَ الْقَصْدَ فِي الْغِنَى وَالْفَقْرِ، وَأَسْأَلُكَ نَعِيمًا لاَ يَنْفَدُ، وَأَسْأَلُكَ قُرَّةَ عَيْنٍ لاَ تَنْقَطِعْ، وَأَسْأَلُكَ الرِّضَا بَعَدَ الْقَضَاءِ، وَأَسْأَلُكَ بَرْدَ الْعَيْشِ بَعْدَ الْمَوْتِ، وَأَسْأَلُكَ**

لَذَّةَ النَّظَرِ إِلَى وَجْهِكَ، وَالشَّوْقَ إِلَى لِقَائِكَ، فِي غَيْرِ ضَرَّاءَ مُضِرَّةٍ، وَلاَ فِتْنَةٍ مُضِلَّةٍ، اللَّهُمَّ زَيِّنَّا بِزِينَةِ الإِيمَانِ، وَاجْعَلْنَا هُدَاةً مُهْتَدِينَ﴾النسائي.
خوایە بە زانستت بە نەزانراوەکان ، و بەو توانایەی هەیتت بەسەر دروستکراواندا، بمژیێنە تا ئەوکاتەی دەزانی ژیان خێری تێدایە بۆم، بمرێنە ئەوکاتەی کە دەزانی مردن خێرە بۆم، خودایە داوای ترسان لەخۆتت لێدەکەم لە پەنهانی و ئاشکراییدا، پەروەردگارا داوای وتنی حەقت لێدەکەم لەکاتی تووڕەیی و کاتی ڕازی بونمدا ، داوای ژیریت لێدەکەم لە کاتی هەژاری و دەوڵەمەندی ، داوای نیعمەتێک دەکەم کە تەواو نەبێ ، خودایە داوای ڕۆشنایی چاوانم دەکەم کە لێم جودا نەبێتەوە ، داوای ڕازی بوون دەکەم دوای ڕوودانی هەر ڕوداوێک لێم ، خودایە داوای ژیانێکی خۆشت لێدەکەم دوای مردنم ، خودایە داوای چێژی بینینی ڕوخسارت لێدەکەم ، خودایە داوای ئارەزووی گەیشتن بەخۆتت لێدەکەم ، بەبێ زیانێک کە زیانبارم بکات ، وە بەبێ تاقیکردنەوەیەک کە گومڕام بکات ،خودایە بە بمان ڕازێنەوە بە ڕازێنەرەوەی باوەڕ ، خودایە بمانکە بە هیدایەت دراوێکی هیدایەتدەر.

٩٠ـ ﴿اللَّهُمَّ طَهِّرْنِي مِنَ الذُّنُوبِ وَالْخَطَايَا، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْهَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنْ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ طَهِّرْنِي بِالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ وَالْمَاءِ الْبَارِدِ﴾ النسائي.
خودایە خاوێنم بکەوە لە تاوان و هەڵەکانم ، خودایە پاکم بکەوە هەروەک چۆن جلێکی سپی لە چڵک خاوێن دەبێتەوە ، خودایە خاوێنم بکەوە بە بەفر و باران و ئاوی سارد.

٩١ـ ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ﴾ابن ماجه.
خودایە من داوای زانستی بەسوود لێدەمەم وە پەنات پێدەگرم لەزانستێک کە سود نەبێت.

٩٢ـ ﴿اللَّهُمَّ أَلِّفْ بَيْنَ قُلُوبِنَا ، وَأَصْلِحْ ذَاتَ بَيْنِنَا ، وَاهْدِنَا سُبُلَ السَّلامِ ، وَنَجِّنَا مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ، وَجَنِّبْنَا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ لَنَا وَمَا بَطَنَ ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي أَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُلُوبِنَا وَأَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا ، وَتُبْ عَلَيْنَا ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ، وَاجْعَلْنَا شَاكِرِينَ لِنِعْمَتِكَ ، مُثْنِينَ بِهَا قَابِلِينَ لَهَا ، وَأَتِمَّهَا عَلَيْنَا﴾أخرجه حاكم.
خوایە ئاشنایی بخەرە نێوان دڵەکانمانەوە و نێوانمانیش چاك بکە ، وە ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگاکانی ئاشتی و سەلامەتی و ئیسلامەتی ، وە ڕزگارمان بکە لە تاریکاییەکانەوە بۆ

ڕووناكی ، وه به دوورمان گره له خراپه‌كان ئه‌وه‌ی كه ئاشكرایه و ئه‌وه‌شی كه شاراوه‌یه ، وه به‌ره‌كه‌ت بخه‌ره نێو بیستنمان و بینینمان و دڵه‌كانمان و خێزانه‌كانمان و نه‌وه‌كانمانه‌وه ، وه ته‌وبه‌مان لـێ وه‌رگره به‌ڕاستی تۆ زۆر ته‌وبه وه‌رگری و به به‌زه‌ییت ، وه بمانكه‌ره به‌شێك له كه‌سه شوكرانه‌بژێره‌كانی نیعمه‌ته‌كانت ، ستایشت بكه‌ین له سه‌ری و قبوڵی بكه‌ین و ته‌واو و كامڵیشی بكه به سه‌رماندا .

٩٣ـ ﴿اللَّهُمَّ أعِنَّا عَلَى ذِكْرِكَ، وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ﴾الحاكم.
خوایه یارمه‌تیم بده له‌سه‌ر زیكركردن و شوكركردن وچاكێتی په‌رستنت.

٩٤ـ ﴿اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كُلُّهُ، اللَّهُمَّ لاَ قَابِضَ لِمَا بَسَطْتَ، وَلاَ بَاسِطَ لِمَا قَبَضْتَ، وَلاَ هَادِيَ لِمَنْ أَضْلَلْتَ، وَلاَ مُضِلَّ لِمَنْ هَدَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُقَرِّبَ لِمَا بَاعَدْتَ، وَلاَ مُبَاعِدَ لِمَا قَرَّبْتَ، اللَّهُمَّ ابْسُطْ عَلَيْنَا مِنْ بَرَكَاتِكَ، وَرَحْمَتِكَ، وَفَضْلِكَ، وَرِزْقِكَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ الْمُقِيمَ الَّذِي لاَ يَحُولُ وَلاَ يَزُولُ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ يَوْمَ الْعَيْلَةِ، وَالأَمْنَ يَوْمَ الْخَوْفِ، اللَّهُمَّ إِنِّي عَائِذٌ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا أَعْطَيْتَنَا وَشَرِّ مَا مَنَعْتَنَا، اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الإِيمَانَ وَزَيِّنْهُ فِي قُلُوبِنَا، وَكَرِّهْ إِلَيْنَا الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ، وَاجْعَلْنَا مِنَ الرَّاشِدِينَ، اللَّهُمَّ تَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ، وَأَحْيِنَا مُسْلِمِينَ، وَأَلْحِقْنَا بِالصَّالِحِينَ غَيْرَ خَزَايَا وَلاَ مَفْتُونِينَ، اللَّهُمَّ قَاتِلِ الْكَفَرَةَ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ رُسُلَكَ، وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ، وَاجْعَلْ عَلَيْهِمْ رِجْزَكَ وَعَذَابَكَ، اللَّهُمَّ قَاتِلْ كَفَرَةَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ، إِلَهَ الْحَقِّ [آمِينْ]﴾
أحمد بلفظه.

خوایه هه‌موو سوپاس و ستایشێک بۆ تۆیه، خوایه گیان هیچ كه‌س نیه شتێكم لێ بگرێته‌وه كه تۆ بۆمت فه‌راهه‌م كردبێ، وه هیچ كه‌سیش نیه شێتكم بۆ فه‌راهه‌م بكات و به‌دی بێنێ كه تۆ گرتبێتته‌وه لێم، وه هیچ كه‌س ناتوانێ كه‌سێ هیدایه‌ت بدات كه گومڕا بوبێ، وه هیچ كه‌سیش ناتوانێ كه‌س گومڕا بكات كه تۆ هیدایه‌تت دابێ، هیچ به‌خشینێكیش نیه كه تۆ ڕێگریت لێ كردبێ، وه‌هیچ ڕێگرییه‌كیش نیه كه تۆ به‌خشیت بێ، وه هیچ نزیككه‌ره‌وه‌یه‌كیش نیه كه تۆ دورت كردبێته‌وه وهیچ دوركه‌ره‌وه‌ش نیه كه تۆ نزیكت كردبێته‌وه، خوایه گیان له به‌ره‌كه‌ت و ڕه‌حمه‌ت و فه‌زڵ و ڕزقت بڕژێنه به‌سه‌رماندا، خوایه گیان من داوای به‌خشینێكت لێ ده‌كه‌م كه نه‌گۆڕێت و له‌ناو نه‌چێت ، هه‌روه‌ها داوای به‌خشینت لێده‌كه‌م له ڕۆژانی هه‌ژاریدا، وه ئه‌من و ئه‌مان له ڕۆژانی ترسدا ، خوایه گیان من ژه‌نام گرتوه به تۆ له هه‌موو شه‌ڕێك كه توشمان ببێت

و هەموو شەڕێکیش کە ڕێگریت کردبێ کە توشمان ببێ، خوایە گیان ئیمانمان لا خۆشەویست بکە و ڕازاوەی بکە لە دڵماندا، وە کوفر و تاوان و مەعسیەتمان لا ناشرین بکە ، وە لە ژیر و عاقڵەکانمان بکە ،وە بە موسڵمانێتی بمانمرێنە، وە بە موسڵمانێتیش زیندومان بکەرەوە، وە لەگەڵ چاکەکاران هەژمارمان بکە ، خوایە گیان دژایەتی بێباوەڕان بکە و لەگەڵیان بجەنگە ئەوانەی کە پێغەمبەرانت بە درۆ دەخەنەوە، وە لەڕێگای تۆ خەڵکی دوردەخەنەوە، وە سزای خۆتیان بۆ دابەزێنە، وە ئەو کافرانەش کە خاوەن کتێبی ئاسمانین لە جولەکە و گاورەکان (آمين).

٩٥ـ ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ يَا أَللَّهُ بِأَنَّكَ الْوَاحِدُ الْأَحَدُ، الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ، أَنْ تَغْفِرَ لِي ذُنُوبِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾النسائي بلفظه.
ئەی خوایە داوات لێ دەکەم بەوەی کە تۆی تاک و تەنها وە جێ نیازی بێ نیازی وە کەست لێ نەبووە وەلەکەسیش نەبویتە وە هیچ هاوشێوەت نیە لە دروسکراوەکانت لە تاوانەکانم خۆش بیت بەڕاستی توی لێخۆشبووی لەبەندەکانت وە خاوەن ڕەحمەتی.

٩٦ـ ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدَ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ [وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ] الْمَنَّانُ [يَا] بَدِيعَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، يَا ذَا الْجَلالِ وَالإِكْرَامِ، يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ، إِنِّي أَسْأَلُكَ [الْجَنَّةَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ] ﴾أبو داود.
ئەی خوایە داوات لێ دەکەم بەوەی تۆی خاوە سوپاس وستایشێکی تەواو هیچ پەرستراوێک نیە بەحەق جگە لە تۆ [ تەنهایت و شەریکت نیە ] تۆی منەتکار بەسەر بەندەکانت ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی ئەی پەروەردگاری خاوەن گەورەی وریێز ئەی زیندوو و هەڵسوڕێنەری کاری بەندەکانت من داوای بەهەشتت لێ دەکەم و پەنات پێ دەگرم لە ئاگر.

٩٧-﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، الأَحَدُ، الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ، وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾أبو داود.
ئەی خوایە داوات لێ دەکەم بەوەی کە شاهیدی دەدەم تۆی خودا و و شاهیدی دەدەم کە هی پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە تۆ تاک و تەنهای وە جێ نیازی بێ نیازی وە کەست لێ نەبووە وەلەکەسیش نەبویتە وە هیچ هاوشێوەت نیە لە دروسکراوەکانت .

**٩٨ـ ﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي، وَتُبْ عَلَيَّ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الْغَفُورُ﴾**أبو داود.
**ئەی پەروەردگارا لێم خۆش بە وە تەوبەم قبوڵ کە ، بەڕاستی تۆی تەوبەی بەندەکانت وەردەگری و لێیان خۆش دەبی.**

**٩٩-﴿اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ [السَّبْعِ] وَرَبَّ الْأَرْضِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْفُرْقَانِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ﴾**أخراج مسلم.
**پەروەردگارا ئەی خودای هەر حەوت ئاسمانەکان و خودای زەمین ، ئەی خاوەنی عەرش و تەختی مەزن ، پەروەردگاری ئێمە و پەروەردگاری هەموو شتەکانی دیکە ، ئەی دەرهێنەری ڕوەک و دانەوێڵەکان لە تۆوەکانیان ، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و فورقان ، پەنات پێدەگرم لە زیان و خراپەی هەموو ئەوانەی نێوچاویان بەدەستی تۆیە و ملکەچن بۆت ، ئەی خودایە تۆ یەکەمیت و پێشت هیچ شتێک نەبووە ، وە دواهەمینیت و لەدوای تۆ هیچ شتێک بوونی نییە ، وە تۆ دیار و ئاشکرایت و هیچ شتێک لەسەرووی تۆوە نییە ،هەرتۆ بە نهێنیەکان شارەزایت هیچ شتێك لە تۆ ناچێت ، قەرزەکانمان بدەوە و دەوڵەمەندمان بکە لە فەقیریەوە**

**١٠٠ـ ﴿اللَّهُمَّ ارزُقني حُبَّكَ، وحُبَّ مَنْ يَنْفَعُني حُبُّهُ عندَك، اللَّهُمَّ مَا رَزَقْتَني مِمَّا أُحِبُّ فَاجْعَلْهُ قُوَّةً لِي فِيمَا تُحِبُّ، اللَّهُمَ مَا زَوَيْتَ عَنِّي مِمَّا أُحِبُّ فَاجْعَلْهُ فَرَاغاً لِي فِيمَا تُحِبُّ﴾**أخراج الترمذي.
**خودایە خۆشویستنی خۆتم پێ ببەخشە ، وە خۆشویستنی ئەوکەسەشم پێ ببەخشە کە کە خۆشویستنی لای تۆ سودی هەبێت بۆم ، خودایە ئەوەی کە بەخشیوتە بەمن لەوەی کە خۆشم دەوێت بیکەیە هێز و توانا لەوەدا کە تۆ پێتخۆشە ، خودایە .**

((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، [فِي الْعَالَمِينَ] إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ))

والحمد لله رب العالمين، كما يليق بجلاله، وعظيم سلطانه، اللهم صلِّ وسلِّم على نبينا محمد، وعلى آله، وأصحابه، وأتباعه بإحسان إلى يوم الدين.

له كۆتایدا:ـ سوپاس بۆ خودای گەورە كە كاری بۆ ئاسانكردم و توانم ئەم كتێبەش بەكۆتا بگەیەنم و تەواوی بكەم سوپاسی بێ پایەنم بۆ ئەو خوشك و برا بەڕێز و ئازیزانەی كە یارمەتیان داوم بۆ وەرگێڕانی دوعاكان بۆ زمانی كوردی لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە پاداشتیان بە بەهەشتی بەرین باتەوە وە لە دوعای خێر بێ بەشمان مەكەن ، وە لە خودای گەورە دەپاڕێمەوە كە ئەم كارە بچوكەم بە نیازێكی پاك لێ قبوڵبكات ، وە لەهەر هەڵە و كەم و كورتیەك كە پێش چاوتان كەوتوە چاوپۆشیم لێبكەن چونكە تەنها پەروەردگارمان كاملە بێ كەم و كورتیە.

خوشكی بچوكتان: دایكی عەممار

﴿ سبحانك اللهم وبحمد واشهد أن لا إله إلا أنت استغفرك وأتوب إليك﴾